# پێشەکی:

الْحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِالله مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ..

دەبێت ئێمە سەرەتا بزانین کەوا هۆکارێک هەیە بۆ دروست بوونمان وە هاتنمان بۆ ئەم دوونیایە کە پڕیەتی لە تاقیکردنەوە،

تاقیکردنەوەکان بە پێی مرۆڤەکان دەگۆڕدرێ هەندێک لە ناز و نیعمەت دا تاقیدەکرێنەوە هەندێک لە نەبوونی یان نەخۆشی یان لەش ساغی،

ئێمە لێرەدا تاقیدەکرێینەوە لەسەر هەموو ئەو شتانە کە الله تعالی پێمان دەبەخشێ یان بەسەرمان دەهێنێت بۆ ئەوەی بزانێت کەوا ئێمە سوپاس گوزاری ئەوین یان نا شوکرین!

وە ئێمە لێرەدا تاقیدەکرێینەوە لەسەر ئامانجێک کە الله تعالی لە نەبوونەوە ئێمەی بۆ هێناوەتە بوون ئەویش پەرستنە هەروەک دەفەرموویێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[1] واتە: وە من جن و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن.

کەواتە الله تعالی کاتێک ئێمەی دروست کردووە تەنیا بۆ پەرستن دروستی کردووین وە تاقیدەکرێیەوە لەسەر ئەم پەرستنە، لەوەیە بپرسی ئایە مادام بۆ پەرستن دروستی کردووین هیچ ڕێگەی بۆ داناوین ئایە چۆن بیپەرستین؟

**لە وەڵامدا ئەڵێین:** بەڵێ الله تعالی ڕێگەی بۆ داناوین وە ئاگاداریشی کردوینەتەوە کە نابێت لەم ڕێگەیە لابدەین، الله تعالی مەنهەج و پڕۆگرامێکی بۆ ئێمە ناردووە کە ئەبێ پەیڕەوی بکەین و لەسەر ئەم مەنهەج و پڕۆگرامە بڕۆین کە ئەویش شەریعەتی ئیسلامە وە قورئان و سوننەتی پێشەوا و سەروەرمان:(مُحَمَّد) ـە ﷺ،

[1] - [٥٦ -الزاريات]

ئێمە ئەبێ لەڕێگای کتابەکەی الله تعالی کە کەلامی ئەوە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ هاتووە پەیڕەوی ئەوەبکەین نابێت هیچشتێک پێچەوانەی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ ئەنجام بدەین وە نابێت هیچ شتێکیشی بۆ زیاد بکەین و بەدوای بیدعە و خوڕافیاتی کۆمەڵە خەڵکانێکی جاهیل بکەوین،

بەڵکو ئەبێ وەک خۆی کە چۆن هاتووە بۆمان و پێیان گەیشتوە جێبەجێی بکەین لەبەر ئەوەی ئەم دینە بە تەواوی و بێ کەم و کوڕی دابەزیووە، الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ واتە: ئەمڕۆ دینەکەتم بۆ کامڵ کردووە، نیعمەتی خۆمم لەسەر تۆ تەواو کردووە و ئیسلامم وەک دینەکەت هەڵبژاردووە..

بۆیە ئێمە ناتوانین لەخۆمانەوە شت بێنینە ناو دین و بۆیی زیاد بکەین لەبەر ئەوەی دینێکی کامڵ و بێ کێشەمان بۆ ڕەوانە کراوە،

ئێستا زانیمان دین لە چی وەر ئەگیرێت کە سەرچاوەکەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ ـە، وە ئەبێ بشزانین کە الله تعالی چ جۆرە عیبادەتێکی قبووڵە وە چ جۆرێکی داوا لێکردووین،

١- الله تعالى عیبادەتێکمان لێ قبووڵ دەکات کە خالص بۆ ئەو بێت وە بەنیەتێکی پاک و تەنیا لەبەر خاتری ئەوبێت.

٢- ئەو عیبادەتەی دەیکەین لە قورئان و سونەتی پێغەمبەرمان ﷺ دا هەبێت و دوور بێت لە هەموو جۆرە داهێندراوێک و بیدعە و خوڕافیاتێک.

٣- عیبادەتێک دوور لە شیرک و هاوبەشی پەیداکردن بێت، الله تعالى بە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[٢]

واتە: ئێمە بە تۆ و بەوانەش کە بەر لە تۆ بوون، ڕامان گەیاند؛ هەر کەسی تر بپەرستی، بێ گومانبە کارەکەت لێ پووچەڵ دەبێ و لە ڕیزی زیانبارانی.

وە هەروەها لە سوڕەتی نساءدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا﴾[٣] واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە

---

[٢] -الزُّمَرْ٦٥
[٣] ـ النساء ٤٨

هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە.

کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە الله تعالى لە هەموو شتێک زیاتر ڕقی لەچییە وە لەچیش خۆشنابێت، بەڕاستی ئەوانەی کە شیرک بڕیار دەدەن و لەسەر ئەم شیرکە ئەمرن ئەوا الله تعالى لە ڕیزی خەسارەت مەندانیان هەژمار دەکات و هەرگیز لێیان خۆشنابێت بۆ ئەبەدی لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەمێنەوە.

لێرەدا گەورەترین مەعسیەت و تاوانمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەویش شیرکە، کە الله تعالى لێی خۆشنابێت بۆ ئەبەدی لە ئاگردا ئەیهێڵێتەوە گەر لەسەر ئەم شیرکە بڕواتەوە لای الله تعالى هەروەک الله تعالى لە قورئان دا لەسەر دەمی لوقمان بە کوڕەکەی دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[٤] واتە: وە کاتێک لوقمان لە کاتی

---

[٤] ـ لقمان ١٣

ئامۆژگاریدا به کوڕەکەی وت: کوڕەکەم شەریک مەکە لەگەڵ خودا، بەڕاستی شیرک ستەمێکی گەورەیە.

الله تعالی بە ڕەحم و بەزەیی خۆی لێمان خۆشبێت وە لەم تاوانە گەورە بمان پارێزێت.

وە ئەو نوسینە هەڵێنجراوی کتێب و مەتنەکانی سەلەفە.

دوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت کە الله تعالی ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون بێ ئامانج نەبوو، وە بۆشمان دەرکەوت کە الله تعالی بۆ عیبادەت ئێمەی هێناوەتە بوون، وە چۆن لێمان قبووڵ دەکات و خۆمان لە شیرک و هاوبەش پەیدا کردن بپارێزین لەبەر ئەوەی لێی خۆش نابێت:

ئێستا بابەتێکی تردێتە پێش کە گەڕانەوە بۆ لای الله تعالی ـیە!

## ئایە کە ئێمە مردین هیچ شتێکمان لێ ئەپرسێتەوە؟

## یان چۆن لێپرسینەوە دەست پێدەکات؟

بۆ جوابی ئەم پرسیارە کە زۆر هەستیارە کە ئێمە لە دونیادا ئەبێ خۆمانی بۆ ئامادە بکەین بۆ ژیانی ناو گۆڕ تاوەکو کاتی لێپرسینەوە.

ئەوانیش سێ پرسیارەکەی ناو گۆڕن کە ئەبێ لە دونیادا بەدەستمان هێنابێ وە زانیاری و عیلمان پێیان هەبێ کە لە دونیادا نەمان توانیبێت ئەم زانستە گران بەهایە بەدەست بهێنین لە قیامەت و ژیانی ناو گۆڕیشمان لە ناخۆشترین کاتەکان ئەبێ و لە خەسارەت مەندان دەبین بۆ هەتا هەتایە،

- سێ پرسیارەکەی ناو گۆڕ چین؟، وە چۆن جوابمان پێ ئەبێ؟

سێ پرسیارەی ناو گۆڕ کە لێمان دەکرێن:

١- من ربک؟ (خودات کێ بوو؟).

٢- ما دینک؟ (دینت چی بوو؟).

٣- من نبیک؟ (پێغەمبەرت کێ بوو؟).

ئەمانە سێ پرسیارەکەی ناو گۆڕن!!

کە لە دونیادا ئەهلی شوێن کەوتنی دین و دەست گرتن بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەبوویت ئەوا جوابی ئەم پرسیارانەت پێ نادرێتەوە هەر ئەوەنییە کە تۆ سەر زارەکی بیانڵێیت ئەبێ عیلم و زانیاری تەواوت پێیان هەبێت و لە دونیادا شوێنیان کەوتبیت و کارت پێیان کردبێت وە بە دڵ و بە زوبان و کردەوە پێکردن پابەند بوویت پێیانەوە.

لێرەدا سەرەتا ئەوەی باسیدەکەین ناسینی الله تعالى ـیە کە ئەبێ بیناسین بە ناو و سیفات و بە کردارەکانیەوە واجبە لەسەرمان کە الله تعالى دەفەرموێت:

﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ﴾[٥] واته: كەواتە بزانە جگە لە خوای گەورە هیچ خودایەک نییە، داوای لێخۆشبوون بکە بۆ تاوانەکەت و بۆ پیاو و ژنە ئیماندارەکان، تا چەند و لە کوێ هەڵکەوتوویت؟

وە ئەبێ بیناسین بۆ ئەوەی لە شیرک و کوفر و مەعسیەت بەدووربین و جاهیل نەبین بە ناسینی الله تعالی، نەکەوینە ڕیزی خەسارەت مەدانەوە

هەروەک الله تعالی دەفەرموویت:

﴿بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ واتە: بە ناوی خودای میهرەبانترین و میهرەبانترین.

﴿قُلْ هُوَ اللَّـهُ أَحَدٌ﴾ واتە: ئەی موحەممەد! ﷺ بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کە من دەیپەرستم، تاک و تەنیایە و، هاوەڵ و هاوبەشی نیە.

---

[٥] - سورة محمد - ١٩]

﴿اللَّـهُ الصَّمَدُ﴾ واته: ئەو خوایە کە ناوی (الله) ـیە، جێگای هیوا و ئومێدە و، بێ نیازیشە، هیچ کەسێکیش -بێ لەو- شیاوی ئەوە نییە گیروگرفتەکان ببرێنە لای بۆ چارەسەر، هەر ئەو زاتە گەورەیەشە، کە دەبێ هەر بۆلای ئەو بگەڕێینەوە.

﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾ واته: کەسی لێ نەبووە و، هیچ ڕۆڵەیەکی نیە -وەک جولەکە و گاور و بتپەرستەکان دەڵێن-، چونکە خوا زۆر بڵند و پاک و بێخەوش و دوورە لەو جۆرە بیرو بۆچوونانە.

﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ واته: و هەرگیز هیچ کەسێک هاوشێوە و هاوتای نیە و، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات.

بۆیە ئێمە دەبێت زانستمان بەوە هەبێت کە الله تعالی تاک و تەنهایە، و هیچ هاوەڵێکی نییە لە پەرستندا، بۆیە کە لە دونیادا الله تعالی نەناسین ئەوا لە قیامەت دا ناتوانین بیناسین لە خەسارەت مەندان دەبین.

# ئایە ناسینی اللە تعالی بەچی دەبێت؟

• ناسینی اللە تعالی بە تەوحید دەبێت:

تەوحید چییە؟، واتای چییە؟

• تەوحید واتا بەتاک دانانی اللە تعالی لە پەرستندا و بێ شەریک دانانی لە عیبادەت دا، هیچ شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، کە اللە تعالی خۆشی فەرمانمان پێدەکات کە بڵێین: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق جگە لە اللە کە شایەنی پەرستن بێت.

لێرەدا کە ئێمە دەڵێین «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» ئەوا نەفی هەموو خوایەک دەکەین جگە لە اللە تعالی وە دان بەوەش دا ئەنێین کە تەنها اللە تعالی شایەنی پەرستنە.

بۆیە «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» کرۆکی ئیمانە و دەست پێکی مرۆڤی موسڵمانە کە ئەبێ ماناکەی بزانین وە بزانین کەوا داوای چیمان لێدەکات.

لێرەوە دەست دەکەین بە ڕونکردنەوەی «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ»

- «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» دابەش دەبێت بەسەر دوو ڕووکن:

یەکەم: (نەفی) واتە (نەرێکردن)؛ کە (لَا إِلَهَ) دەگرێتەوە، نەفی هەموو خوایەک دەکەیت لە پەرستن و سەمع و تاعە و هانا و پەنابردنمان تەنیا بۆ الله تعالی.

دووەم: (اثبات) ـە واتە (جێگیرکردن) ؛ کە (إِلَّا اللهُ) دەگرێتەوە دان بەوە دائەنێیت کە تەنیا الله تعالی شایەنی پەرستن و سەمع و تاعە کردنە و شایەن ئەوەیە کە هانا و هاوار و پاڕانەوەمان بۆ ئەو بێت.

بەڵێ بەم شێوەیە عیبادەتی الله تعالی دەکەین کە پێی دەوترێ تەوحید وە تەوحید لە «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» ـوە سەرچاوەی گرتووە

## تەوحید چۆنە؟، ئایە جۆری هەیە؟

هەروەک پێشتر باسمان کرد تەوحید واتا بە تاک دانانی الله تعالی لە پەرستندا.

- وە سێ جۆر تەوحیدمان هەیە ئەوانیش:

١- توحيد الربوبية.

٢- توحيد الألوهية.

٣- توحيد الأسماء والصفات.

هەریەکەیان چەند تێبینیەک لە خۆدەگرێت پشتیوان بە الله تعالی دانە بە دانە ڕوونکردنەوەی بۆ ئەدەین.

• جۆری یەکەمی تەوحید: (توحيد الربوبية):

بریتییە لە بەتاك دانانی الله تعالى بە کارەکانی، بەوەی کە بەندە بڕوای وابێت بە تەنها الله بەدیهێنەری هەموو مەخلوقاتە، ڕۆزی دەریانە، خاوەنیانە، بەڕێوەبەری تەواوی کار و بارەکانیانە، شەو و ڕۆژ ئاڵوگۆڕ دەکات و بەسەر یەکتردا دەیانهێنێت، زیندوو دەکاتەوە و دەمرێنێت، بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

دەبێت باوەڕمان بەوە هەبێ کە هەموو ئەو کارانە تەنیا بە دەستی الله تعالى یە وە لە توانای هیچ کەسێکی تردانییە کە خۆی بە تەنیا سەر پەرشتی دەکات و لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدایە.

وە لەژێر سایەی ئەم تەوحیدە بۆمان دەردەکەوێت کە هەرچی بەسەرمان دێت لە خۆشی و ناخۆشی لە قەدەری الله تعالى وەیە وە تەنیا بە ویستی الله تعالى یە.

## جۆری دووەمی تەوحید:

٢- توحيد الألوهية: بریتییە لە بەتاك دانانی خوای گەورە لە پەرستن و عیبادەتەكاندا وەكو دوعا و نەزر و سەربڕین و ئومێد خواستن و پشت پێ بەستن و هاوشێوەكانی كە زانایان باسیان كردووە، وە ئەم جۆرەش لە جۆرەكانی تەوحید، بریتییە لە كرۆكی بانگەوازی هەموو پێغەمبەران، چونكە ئەوە بنچینەیە و كردەوەكانی تری لەسەر بونیاد دەنرێت، وە بەبێ پەیڕەو و پیادەكردنی ئەم جۆرە تەوحیدە كردەوەكان ڕاست و ڕاساڵ نابن و بەڵكو دژەكەی دێتەكایەوە كە ئەویش شیرك و هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا.

دوای ئەوەی پێناسەیەكی توحيد الألوهيةمان زانی وە پێویستە كە ڕوونتر بێتە بەرچاومان و جوانتر لێی وردبینەوە ئایە بۆ كرۆكی بانگەوازی گشت پێغەمبەرانە؟، چۆن بتوانین ئەم تەوحیدە بەرجەستە بكەین لە ژیانماندا؟

• هەر شتێک وابەستەی قورئان و سوننەت بێت و الله تعالى پێی خۆشبێت پێی ئەوترێت عیبادەت وە عیبادەتیش لە ژێر چەمکی تەوحیدی الألوهیة کۆدەبێتەوە.

کەواتە هەر عیبادەتێک وابەستە بە قورئان و سوننەت بێت و الله تعالى ڕەزامەند بێت وە تەنها بۆ الله تعالى بێت خالصەن ئەوا پێی دەوترێت تەوحید الألوهیة.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە تەوحید الألوهیة دەمان پارێزێت لە پەیدا کردنی شیرک و هاوبەشی پەیدا کردن بۆ الله تعالى کە گەورەترین تاوانە لای الله تعالى لێ خۆشبونی بۆ نییە.

• الله تعالى لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: «وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ»[٦]

واتە: ڕۆزیتان و هەرچی بەڵێنتان پێدەدرێت، لە ئاسمانە.

---

[٦] - سورة الذاريات - ٢٢

کەواتە الله تعالی پێمان دەڵێت کەوا ڕزق و ڕۆزی ئێمە لە کوێیە وە لە لایەن خۆشیەوە بۆمان دابین دەکرێت وە هەر ئەبێت داوا لە خۆشی بکەین بۆ ئەوەی پێمان ببەخشێ.

وە هەر الله تعالی بە ڕۆزی دەر و رازقی خۆمانی بزانین، وە تەنها سوپاس گوزار و شوکرانە بژێری الله تعالی بکەین لەسەر ئەوەی کە پێمان دەبەخشێت.

وە هەر کەسێک یان هەرشتێک بکەینە هاوبەش لەم عیباداتانە ئەوە توشی شیرک و کوفری گەورە دەبین.

بۆیە دەبێت بە دڵ و بە قسە و کردەوە بیسەلمێنین کە ئەم عیباداتانە تەنیا بۆ الله تعالی ئەنجام دەدەین و کەس ناکەینە شەریک و هاوبەشی.

- وه هەروەک الله تعالى لە قورئانی پیرۆز بە پێغەمبەر ابراهیم دەفەرمووێت:

«قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ»[٧]

واتە: بڵێ دوعا و قوربانی و گیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە.

کەوایە ئێمەش شوێنکەوتەی دینی پێغەمبەر ابراهیم و گشت پێغەمبەرانی ترین کە هەموو کار و کردەوەیەک و نوێژ و سەربڕین و عیبادەتێکیان تەنیا لە پێناو الله تعالى ـدا بووە.

---

[٧] - سورەالأنعام - ١٦٢]

## جۆری سێهەمی تەوحید:

٣- تەوحید الأسماء و صفات: بریتییە لە باوەڕبوونێکی تەواو بەوەی کە خوای گەورە چەند ناوێکی جوان و سیفاتگەلێکی بەرز و تەواوی هەیە، کە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ هاتوون، ئەو زاتەش هەموو صیفاتێکی تەواوی هەیە و پاك و بێگەردە لە هەموو صیفاتێکی ناتەواو و کەموکورت، وە تاك و جیاوازیشە بەوە لە هەموو دروستکراوەکان.

• لە تەوحیدی سێهەم کە بە تەوحید الأسماء وصفات ناونراوە زاتی الله تعالی ـمان بۆ دەردەکەوێت بە پێی قورئان و سوننەت کە الله تعالی چەند سیفاتێکی هەرە بەرزی هەیە وە لە هەرە ناوە جوانەکانی ناوی لە خۆی ناوە کە تەنها ئەو بێ کەموو کوڕییە تەواوی کامڵیەت تەنها لە زاتی الله تعالی ـدایە.

بۆیە ئێمە دەبێت بیناسین وە تەواوی ئەو ناو و صیفاتانەی کە لە قورئان و سوننەت دا هاتووە، باوەڕمان پێی هەبێت و بۆ ئەو إثباتی بکەین.

• ئایە ئێمە چۆن بزانین کە اللە تعالی سیفاتی هەیە؟، یان چۆن بزانین کە اللە تعالی ناوی هەیە؟

ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای قورئان و سوننەت کە اللە تعالی سیفاتی تایبەت بە خۆی هەیە اللە تعالی لە قورئان دا دەفەرموێت: «الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ».

واتە: (الرَّحْمَنُ) ناوێکی اللە تعالی ـیە کە بە مانای میهرەبان دێت کەواتە ئەمە بەڵگەیەکە بۆ اسماء ـکانی اللە تعالی،

(عَلَى الْعَرْشِ) واتە: لەسەر تەخت ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە اللە تعالی شوێن و مەکانی هەیە نەوەک وەک گرووپە گومڕایەکان کە ئەڵێن اللە تعالی بێ مەکان و شوێنە، (اسْتَوَى) بە مانای وەستان دێت کە ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ سیفاتی اللە تعالی.

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەسماء و سیفاتە بۆ اللە تعالی هەر ئەم بەڵگەیەمان نییە، بەڵگەمان زۆرن بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعە ئەمەیان کردووە بە بەڵگەی یەکلای کردنەوەی ئەهلی سوننە و جەماعە

لەبەر ئەوەی زۆرێک لە گروپە گومڕاکان باوەڕیان نییە بەوەی کە الله تعالی شوێن و مەکانی هەیە وە ئەڵێن الله تعالی لە هەموو شوێنێکە کە ئەمەش پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، ئەڵێن الله لەسەر عەرشە و عیلمی الله تعالی لە هەموو شوێنێکە.

- وە لە سیفاتێکی تری الله تعالی کە قسەکردنە کە بەڵگەش بۆ ئەمە قورئانە کە کەلامی الله تعالی ـیە وە نابێت بڵێین مەخلوقە بەڵکو ئەبێ بڵێین کەلامی الله تعالی ـیە و دروستکراو نییە کە قسەکردن سیفاتێکە لە سیفاتەکانی الله تعالی.

بۆیە ئێمە وەک ئەهلی سوننە و جەماعە باوەڕمان وایە کە الله تعالی لەسەر عەرشە وە لە قیامەتیش ئەبیندرێت، وە قسە لەگەڵ بەندەکانی دەکات و چەندەها سیفاتی تر کە لە قورئان و سوننەت دا هاتووە و بۆمان باسکراوە ئێمە دەبێ جێگیری بکەین و دانی پێیدا بنێین.

- ئایه ئێمه دەتوانین وێنای الله تعالی و سیفاتەکانی بکەین؟

نەخێر، ئێمه به هیچ شێوەیەک ناتوانین وێنای الله تعالی و سیفاتەکانی بکەین.

وه الله تعالی دەفەرمووێت: «لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ»[٨]

واته: هیچ شتێک هاوشێوەی الله تعالی نییه ئەو بیسەر و بینەره.

کەوته ئێمه ناتوانین وێنای الله تعالی بکەین و شێوەی بۆ بڕیار بدەین بەڵام إثباتی سیفاتەکانی دەکەین، واته جێگیری دەکەین بەبێ ئەوەی وێنای بکەین.

---

[٨] -[الشوری - ١١]

## بەشی دووەم: ناسینی پێغەمبەرمان ﷺ

دوای ئەوەی لە بەشەکانی پێشتردا توانیمان الله تعالی بناسین بە هەرسێ جۆرە تەوحیدەکەوە لە سەریشمان واجبە کە پێغەمبەری نازدارمان ﷺ بناسین، ناسینی ئەو لەناو گۆڕ و لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو بەندەیەکی موسڵمان ئیشی پێی دەبێت.

• یەکەم شت کە پێویستە بیزانین لەسەر پێغەمبەرمان ﷺ ناوی خۆی و باوک و باپیری وە خەڵکی کوێ بووە، وە لە چ هۆزێکیش بووە.

• ناوی: مُحَمَّد ﷺ باوکی ناوی عَبدُاللّٰه ـیە باپیری ناوی عبدالمطلب ـە،وە عبدالمطلب لە بەنو هاشمە، بەنو هاشمیش لە قوڕەیشە، دایکی ناوی ئامینەی کچی وەهەب ـە.

• لە تەمەنی ٤٠ ساڵی وەحی بۆ هاتووە، کە ماوەی پێغەمبەرایەتی ٢٣ ساڵ بووە، کە ١٠ ساڵ لە مەککە بووە وە ١٣ ساڵ لە مەدینە بووە، ئەمە ناو و نەسەبی پاکی پێغەمبەرمانە ﷺ کە لەسەر هەموو تاکێک واجبە بیزانێت.

• ئێمه بۆچی ئەبێ پێغەمبەر ﷺ بناسین؟

ئێمه شوێنکەوتەی پەیامبەرین که مُحَمَّده ﷺ هەر کەسێکیش که شوێنکەوتەی کەسێک بێت ئەبێ بیناسێ وه له تەوحیدا که «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» ـیه که تەواوکەری دوای ئەو ئەبێ بڵێین مُحَمَّدٌ رَسُوُل اللّهِ ئەگەرنا ئیمانمان تەواو نابێت و لێمان وەرناگیرێ.

وه کەسێک بۆ موسڵمان بوونی که شەهاده دەهێنێ سەرەتا شاهیدی ئەدات بەوەی که (أَشْهَدُ أَنّ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا الله) هیچ پەرستراوێک بەحەق نییه جگه له الله.

مەرجی دوەمی شاهیدیەکەمان ئەوەیه که بڵێین: (وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله) که مُحَمَّد پێغەمبەری الله تعالی ـیه.

وەک چۆن «لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ» مەرجی هەیه: (وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله) ئەمەشیان مەرجی خۆی هەیه،

ئەوەیە کە شاهێدی بدەین کە مُحَمَّد پەیامبەر و پێغەمبەری خودایە ﷺ، وە شەریعەتەکەی قبووڵ بکەین و هیچ ڕق لێبوونەوەیەکمان نەبێت و لەسەر ئەوە بڕۆین کە ئەو بۆی هاتووە.

وە ئێمە نابێت لەسنوری بەندە بیبەینە دەر وە ناشبێ لە پلە و مەقامی ئەو کەم بکەینەوە، ئێمە ئەبێ وەک پەیامبەر و پێغەمبەری الله تعالی سەیری بکەین، وە ئەبێ لە دوای الله تعالی لە هەموو کەسێکمان زیاتر خۆشبوێت تەنانەت لە نەفسی خۆشمان.

وە ناشبێت هاناو هاوار و عیبادەتی بۆ بکەین لەبەر ئەوەی ئەویش وەک ئێمە بەندەی الله تعالی ـیە.

• ئێمە بۆچی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ هاتووە حیکمەت لە ناردنی چییە؟

جوابی ئەم پرسیارە الله تعالی ئەمان داتەوە کە لە قورئاندا دەفەرمووێت:
﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾[٩]

---

[٩] -[سورة النحل - ٣٦]

واتە: وە ئێمە پێغەمبەرێکمان بۆ هەموو نەتەوەیەک ناردووە کە خودا بپەرستن و خۆیان لە ستەمکاری بەدوور بگرن.

ئێمە پێغەمبەرمان بۆ هاتووە بۆ ئەوەی الله تعالی بپەرستین چۆن کە خۆی داوای لێکردووین وە لە طاغوتان و زۆرداران دووربکەوینەوە، ئەوانەی کە شەریعەت بۆ خەڵک دادەنێن و ئەڵێن ئێمە یاسامان پێ لە هەموو شتێ سەرووەرترە لە ڕاستیشدا درۆ دەکەن تەنیا بۆ بێدەسەڵاتان سەروەرە، بەڵام ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی لە لایەن الله تعالی ـوە بێ کەم و کوڕیە وە زوڵم لە هیچ کەسێک ناکات.

- وە هەموو پێغەمبەرێک دوو پەیامی پێ بووە:

یەکەم: مژدە دەربوون بۆ ئەو کەسانەی کە سەرپێچی الله تعالی ناکەن و تەنیا ئەو دەپەرستن و شوێن بەرنامەی ئەو دەکەون بەوەی کە شوێنێکیان بۆ ئامادە کراوە کە هیچ ناخۆشیەک و ناڕەحەتیەک نایەتە پێشیان ئەویش بەهەشتە.

دووەم: ترسێنەر بوون بەوەی ئەو کەسانەی سەرپێچی الله تعالى دەکەن و شوێن ڕێبازی ئەو ناکەون وە شوێن طاغوتان و هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون کە شوێنێکیان بۆ ئامادە کراوە کە هیچ خۆشیەک نابینن تێیدا کە ئەویش ئاگری دۆزەخە.

وە لە هەردوو پەیامەکەدا ڕێگاکانی دیاری کراون جوان بۆمان ڕوون کراوەتەوە کە شوێن پێی پێغەمبەرمان ﷺ بگرین ئەوا بۆ بەهەشت ڕێگامان گرتووە، گەر شوێن پێی ئەو نەگرین بۆ دۆزەخ ڕێگامان گرتووە پەنا بە الله تعالى.

• وە شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ تەنیا بە قسە گوتن نییە بەڵکو ئەبێت بە کردار و عەمەل بیسەلمێنین کە شوێنکەوتەی ئەوین وەک: (کردنی سیواک، و ڕیش هێشتنەوە و شەڕواڵ کورتی و بە گژداچونەوەی زوڵم و چەسپاندنی چاکە و نەهی کردنی خراپە......).

• حوكمی قسه گوتن به پێغه‌مبه‌ری پێشه‌وامان ﷺ چییه‌؟

حوكمی قسه گوتن به پێغه‌مبه‌ر ﷺ جا قسه گوتن به خودی نه‌فسی خۆی بێت یان به شه‌ریعه‌ته‌كه‌ی یان عه‌یبداری بكات به‌وه‌ی پێی هاتووه ئه‌وا ئه‌و كه‌سه مورته‌د ده‌بێته‌وه و له دین ده‌رده‌چێ وه حوكمه‌كه‌شی كوشتنه.

• ئیمامی مالك ده‌فه‌رمووێت: هه‌ر كه‌سێ جوێن به پێغه‌مبه‌ر ﷺ بدات، یان عه‌یبێک له پێغه‌مبه‌ر ﷺ بگرێت، یان له پله و پایه‌ی كه‌م بكاته‌وه، به‌ڵكو له هه‌ر پێغه‌مبه‌رێكی تر، ئه‌وا له‌ناوده‌بردرێت، جا موسڵمان بێت یان نا، داوای ته‌وبه‌كردنیشی لێ ناكرێت..

• ابوبر بن المنذر ده‌ڵێت: تێكڕای ئه‌هلی عیلم كۆده‌نگن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی جنێوده‌ر به پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ناو ده‌بردرێت.

له‌وانه‌ی كه‌وا ده‌ڵێن: مالك بن أنس، لليث بن سعد، إسحاق بن راهويه، احمدبن حنبل، ئه‌وه مه‌زهه‌بی پێشه‌وا شافعیشه.[١٠]

---

[١٠] - الصارم المسلول لاپه‌ڕه ٣١١،و الشفاء ٢/ ٩٣٦-٩٣٧.

هەر کەس گاڵتە بەوە بکات کە پێغەمبەرمان ﷺ پێی هاتووە یان سوننەتێکی ئەوا بێ دوودڵی لە دین ئەچێتە دەرەوە الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ * لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِنْ نَعْفُ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾[١١] واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسن بە دڵنیاییەوە دەڵێن: ئێمە تەنها گفتوگۆ و یاریمان دەکرد، بڵێ: ئایا ئەوە خوا و نیشانەکانی و پێغەمبەرەکەیە کە گاڵتەتان پێدەکرد؟، هیچ عوزر نەهێنەوە دوای باوەڕەکەت کافر بوویت.. وە ئەگەر ئێمە لە لایەنێکتان خۆشبین، ئێمە سزای لایەنێک دەدەین چونکە تاوانبار بوون.

لێرەدا بە گاڵتە قسەیان کردووە بەڵام الله تعالى بە کافر ناوی بردن دوای ئەوەی ئیمانیان هێنابوو بۆیە شەریعەت و مەنهەج و پێغەمبەرمان ﷺ لەو سنورەدانین کە گاڵتەیان پێبکرێت.

[١١] - سورة التوبة٦٦- ٦٥

## بەشی سێهەم: ناسینی ئیسلام:

وەک موسڵمان لەسەرمان پێویستە کە ئیسلام بناسین، کە بە ئاین و مەنهەجی خۆمانی دائەنێین وە بۆ شارەزابوونی ئیسلام ئەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکان کە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ و ئەقوالی سەلەفی سالحە.

• پێناسەی ئیسلام: إن الإسلام هو الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة والخلوص من الشرك، هذا هو تعريف الإسلام شرعاً، وهو في اللغة: الاستسلام والإذعان، وإذا جئنا إلى العبادة نجد أنها الخضوع والذل، والخضوع والذل والمحبة استسلام وإذعان، فالعبادة هي الإسلام نفسها.

واتە: ئیسلام ملکەچ بوونە بۆ خودا لە ڕێگەی تاکپەرستییەوە و ملکەچ بوونە بۆ خودا لە ڕێگەی گوێڕایەڵی و پاککردنەوە لە شیرک، ئەمە پێناسەی یاساییە بۆ ئیسلام، وە لە ڕووی زمانەوانییەوە: تەسلیم بوون و ملکەچ بوونە، ئەگەر هاتینە سەر عیبادەت، بۆمان دەردەکەوێت کە ملکەچ بوون و زەلیلبوونە، وە ملکەچ بوون و زەلیلبوون و خۆشەویستی ملکەچ بوون و ملکەچبوونە، پەرستنش خودی ئیسلامە.

ئیسلام مەبەست پێی موسڵمان بوونە، لەگەڵ ئیمان و باوەڕهێنان، وە هەروەها ئیحسان و چاکە کاری هەر یەکێک لەم پلانەش پایە و ڕووکنی خۆی هەیە:

- پایە و ڕوکنەکانی ئیسلام پێنجن:

١- شاهیدیدان بەوەی هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق بپەرستریێ جگە لە الله تعالی وە بێگومان مُحَمَّد ﷺ پەیامبەر و پێغەمبەری خودایە.

٢- بە جێگەیاندنی پێنج نوێژە فەرزەکە.

٣- دەرکردنی زەکات لە ماڵ و سامان.

٤- ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان.

٥- حەج کردنی ماڵی خودا.

هەر کەسێک باوەڕی بە یەکێک لەمانە نەبێت پێی کافر دەبێت و لە دین دەچێتە دەرەوە کە بەبێ عوزر نەیان کات، بەڵام هەندێکیان عوزر تێیدا قبووڵ نییە وەک نوێژ کە پێی لە دین دەچێتە دەرەوە ئەو کەسەی نەیکات.

مرۆڤی موسڵمان دەبێت باوەڕی تەواوی بەو پێنج مەرجانەی سەرەوە هەبێت و جێبەجێشیان بکات بەبێ دوو دڵی وە بەو پەڕی پێخۆشبوونەوە.

ئەمانە ڕێباز و مەنهەجی ئیسلامە کە هیچ شتێک دوای ئەو قبووڵ نییە وە هەموو مەنهەجێک خەسارەت مەند و گومڕاییە هەروەک الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[١٢] واتە: وە هەرکەسێک بە دوای ئایینێکی تردا بگەڕێت جگە لە ئیسلام هەرگیز لێی قبوڵ نابێت و لە قیامەتیشدا لە دۆڕاوەکان دەبێت.

---

[١٢] - [ال عمران -٨٥].

کەواتە ئێمە ئەوەی ئەم ئیسلامە بۆی هێناوین ئەبێ قبوڵمان بێت تەنیا ئیسلام بکەینە مەنهەجی ژیانمان لە حوکم و تەشریع و یاسادانان غەیری ئەمە لە دۆڕاوەکان دەبین کە پەیڕەوی بکەین جا هەر چییەک بێت دیموکراسی یان لیبڕالی یان شوعی هەر حوکمێکی دونیا یان هەر ڕێبازێکی دونیامان پەیڕەو کرد لە دۆڕاوان دەبین وە الله تعالی غەیری ئیسلام نەبێت لێمان وەرناگرێت.

کەواتە لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە ئیسلام دینی بەرائەتە لە ئەهلی بەتاڵ و شیرک وە شوێن کەوتنی حەق و تاکپەرستی و خۆ بە دوورگرتن لە هەموو ئەو مەنهەجە بەتاڵانەی دونیا.

## ناساندنی پایەکانی ئیسلام بە بەڵگەوە:

یەکەم: شایەتومان:

الله تعالى دەفەرموویت: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾

واتە: خودا لە ڕێگای دروستکراوەکانیەوە شایەتی دەدا -خۆ هەرخۆی بەسە بۆ شایەتیدان- کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق جگە لە ئەو هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش (لە پێغەمبەران و زانایان) کە بەڕێگەیەکی ڕاست و دروست دەی سەلمێنن کە خودا هەمیشە دادپەروەری ڕەهایە جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە ئەو خوایەکی باڵادەست و دانایە.

کەواتە الله تعالى پێمان دەفەرموویت: کە ئەبێ شایەتی بدەین کە تەنها ئەو شایەنی پەرستن و ملکەچی بۆ کردنە.

• بەڵگە بۆ ئەوەی شایەتی دانمان لەسەر مُحَمَّد ﷺ کە پێغەمبەری خودایە:

﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾[١٣] واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە پێغەمبەرێکتان لە خۆتان بۆ هاتووە بۆ ئەوەی فەرمانی خوداتان پێ ڕابگەیەنێت، زەرەر و زیانی ئێوەی پێ ناخۆشە و ئازاری پێ دەگات، وە زۆر بە پەرۆشە بۆتان خەمی گەورەی ئەوەیە ڕووبکەنە هیدایەت، ڕێگای ڕاستی هیدایەت بگرنە بەر هەروەها دڵی لە لای ئیماندارانە و زۆر بە بەزەیی و میهرەبانە لەگەڵیاندا و خۆشی دەوێن.

مەبەست لە شاهیدیدان کە مُحَمَّد ﷺ پێغەمبەری خودایە، گوێڕایەڵی بیت لەوەی فەرمانی پێکردووە، بەڕاستی بزانیت لەوەی هەواڵی پێداوە، دووربکەوینەوە لەوەی قەدەغە و سەرزنشتی لێکردووە، وە بە هیچ شێوەیەک بەندایەتی و پەرستن ئەنجام نەدەیت بەو شەریعەتە نەبێت ئەو هێناویەتی.

---

[١٣] - ١٢٨ سورة التوبة

دووەم: بەڵگەی نوێژ کردن و زەکاتدان ڕاڤەکردنی یەک خوا پەرستی:

﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾[١٤]

واتە: فەرمانیشیان پێ نەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن بە پاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمان بەرداری ئاین و بەرنامەکەبن و لابدەن لە هەموو ئاینێک تەنها پابەندی ئیسلام بن، نوێژیش بەڕێک و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی خودا.

---

[١٤] - [سورة البينة- ٥].

## سێهەم: بەڵگەی ڕۆژوو گرتن:

الله تعالى دەفەرموویت: ﴿يَأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[١٥]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ڕۆژوو گرتنتان لەسەر فەرز کراوە، هەروەکو لەسەر خاوەن ئاینەکانی پێشوو فەڕز کرابوو، تاوەکو خۆتان لە خراپە بپارێزن و بەندایەتی خودای خۆتان بکەن.

[١٥] - سورة البقرة -١٨٣

## چوارەم: بەڵگە لەسەر حەجکردن:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلبَيتِ مَنِ ٱستَطَاعَ إِلَيهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلعَٰلَمِينَ﴾[١٦]

واتا: خودای گەورە بڕیاریداوە و فەرزی کردووە لەسەر ئەو خەڵکانەی کە توانای (دارایی و تەندروستیان) هەیە حەج و سەردانی (بیت الحرام) بکەن، هەر کەسێکیش باوەڕی بەو حەجە نەبێ، ئەوە با چاک بزانێ کە کافرو بێ باوەڕە، بەڕاستیی خودایش لە تەواوی خەڵکانی جیهان، نەک تەنها هەر لەوان، بێ نیازە.

[١٦] - سورة آل عمران -٩٧].

# ئیمان

ئیمان چییە؟

الإيمان: اعتقاد بالقلب، وقول باللسان، وعمل بالجوارح، يزيد بالطاعة، وينقص بالمعصية. واتە: ئیمان باوەڕهێنانە بە دڵ، وە گوتنی وشەی شایەتوومانە بە زمان، وە کردنی کردەوەیە بە ئەندامەکانی لاشە، وە ئیمان زیاد دەبێت بە کردەوەی باش و کەمیش دەبێت بە تاوان کردن.

هەموو زانایان یەک دەنگن لەسەر ئەم پێناسەیە، وە کردەوەی ئەندامەکانی لاشەش (عمل الجوارح) مەرجی دروستی ئیمانە نەک مەرجی تەواوی ئیمانە.

- ئیمان لە سێ بەش پێکدێت:

١- بیرو باوەڕی دڵ (اعتيقاد بالقلب).

٢- قسەی زووبان (قول باللسان).

٣- کردەوەی لاشە (عمل بالجوارح).

هەرکەسێک ئەم سێ مەرجەی هەبێت ئەوا دەبێتە کەسێکی ئیماندار، بەڵام هەرکەسێک بڵێت ئیمان تەنها بیروباوەڕی دڵ و قسەی زووبانە ئەوا ئەو کەسە کەسێکی مورجیئە و کەسێکی گومڕایە لە ئەهلی سوننە دەرچووە.

وە هەرکەسێک بڵێت ئیمان تەنها بیروباوەڕی دڵە ئەوا ئەو کەسە کەسێکی جەهمییە و کەسێکی کافرە پەنا بە الله تعالی.

- واتە ئیمان لای ئەهلی سەلەف و لە حەدیث و ئەثەرکانی پێغەمبەرمان ﷺ هاتووە کە ئیمان بریتییە لە بیروباوەڕی دڵ و قسەی زووبان و کردەوەی لاشە.

- ئایە ئەتوانی بە خۆت بڵێیت ئیماندار؟

خۆی پرسیار کردن لەبارەیەوە بیدعەیە کە پرسیار پێی لەکەسێک بکەی بەڵام، یەکێکی تر لە بیروباوەڕەکانی ئەهلی سەلەف کە بە خۆیان نەوتووە ئیماندار بەڵکو الاستثناء ـیان بەکار هێناوە و وتویانە ئیماندارم إِنْ شَاءَ اللّٰه.

• ئایە ئیمان کەم و زیاد دەکات یان جێگیرە؟

بەڵێ ئیمان زیاد دەکات بە گوێڕایەڵی و ملکەچ بوون بۆ الله تعالی، وە کەم دەکات بە تاوان و سەر پێچی، ئەمە کۆدەنگی هەموو بیروباوەڕی سەلەفە.

الله تعالی دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾[١٧] واتە: ئیمانداران تەنها ئەوانەن کە کاتێک الله یان دەخرێتەوە یاد دڵیان جۆش و خرۆش دەیگرێت و دەترسن لێی کاتێک ئایەتەکانی خوا دەخوێندرێتەوە بەسەریاندا ئیمانیان زیاد دەکات و پشتپێبەستنی تەواوەتیان تەنها بە پەروەردگاریانە.

بە خیلافی مورجیئەکانی سەرەتاوە کە بیروباوەڕیان وابوو کە ئیمان زیاد ناکات و کەم ناکات بەڵام مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە ئیمان زیاد و کەم دەکات.

---

[١٧] - [سورة الأنفال - ٢].

لە حدیثی پێغەمبەرمان ﷺ دا هاتووە کە ئیمان واتە: «آمنتُ باللهِ، وَمَلَائكَتهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»[١٨] واتە: باوەڕبوون بە خودا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی و باوەڕیان بە چارەنووس و چاکە و خراپەکانی هەیە.

هەر کەسێک باوەڕدار بێت ئەبێت باوەڕی بە شەش پایەکەی ئیمان هەبێت وە جێگیریان بکات وەکو خۆی، گەر بێت و یەکێک لە پایەکانی ئیمان ڕەت بکاتەوە ئەوا لە دین دەچێتە دەرەوە، هەوەکو لە بابی قەدەردا ئێمە ئەبێت بە هەموو شتێک ڕازی ببین کە لە قەدەری ئێمەدا نوسراوە لە لای الله تعالى لە لوح محفوظ ـدا، قەدەر واتە عیلمی الله تعالى، وە هەر کەسێک نەفی عیلمی الله تعالى بکات پەنا بە الله تعالى پێی کافر ئەبێت، نابێت کەس ئینکاری قەدەری الله تعالى بکات، وە ئەبێت باوەڕمان وابێت کە (هەر شتێک ڕوو ئەدات بە ویست و توانای الله تعالى ـیە، هەر زیانێک لێمان ئەدرێت بێ ویستی الله تعالى نابێت  وە ناتوانرێت هیچ سوودێکمان پێ بگەیەنرێت بێ ویستی الله تعالى).

---

[١٨] - [رواه مسلم ٨].

## بەشەکانی ئیمان.

ئیمان حەفتا بەشە پیغەمبەرمان ﷺ دەفەرموویت: «الإيمان بضع وسبعون أو بضع وستون شعبة، فأفضلها قول لا إله إلا الله، وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان»[١٩] واتە: ئیمان حەفتا بەشە باشترینیان ئەوەیە بڵێیت جگە لە خودا هیچ خودایەک نییە و نزمترینیان لابردنی شتە زیانبەخشەکانە لە ڕێگاکە، وە حەیا لقێکی ئیمانە.

- ڕوکنەکانی ئیمان شەشن ؟

١- باوەڕبوون بە خوای عز و جل.

٢- باوەڕبوون بە فریشتەکانی.

٣- باوەڕبوون بە کتێبەکانی.

٤ -باوەڕبوون بە پێغەمبەرەکانی.

---

[١٩] - متفق عليه

٥-باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی.

٦-باوەڕبوون بە قەدەر و خێر و شەڕی (قەزا و قەدەر).

ڕوکنی باوەڕهێنان بە خوای گەورە سبحانە وتعالی:

- باوەڕهێنان بە خوای گەورە لە چیدا بیندراوە؟

ڕوکنی باوەرهێنان بە الله تعالی لە دوو شتدا بیندراوە:

١- باوەڕ بە بوونی خوای گەورە.

٢-باوەڕ بە تەک و تەنیایی خوا لەو شتانەی کە تایبەتن بە خۆیەوە.

• باوەڕبە بوونی خوا چۆنە؟

١- خوا بوونی هەیە.

٢- تاک و تەنهایە.

٣- لە ئاسمانە.

٤- لە دونیا بە چاو نابیندرێت.

٥- دروستکراونییە و هەر هەبووە.

٦- تێکەڵی دروستکراوەکانی نابێت .

٧- بیر لە چۆنییەتیەکەی ناکەینەوە، چونکە ناگەینە ئەنجام لەبەر ئەوەی نەمانبینیوە و هاوشێوەشی نییە وە هەرشتێک بە خەیاڵمان دابێت ئەوە خوا نییە.

• باوەڕ بە تاک و تەنیایی خودا چۆنە؟

باوەڕ به تاك و تەنیایی خوا بەگشتی دوو جۆرە:

١- بەتەنیا ڕاگرتنی لە دروستکردن و خاوەنێتی و بەڕێوە بردنی گەردوون و مرۆڤ و بەهەشت و جەهەنەم و هەموو شتێکدا وە بە تەنیا ڕاگرتنی لە ناو و سیفەتەکانیدا و نەچواندنی بە دروستکراوەکانی.

٢- بە تەنیا پەرستنی خوای گەورە و تەرخانکردنی هەموو عیبادەتەکان تەنها بۆ ئەو.

• بەڵگە بۆ ئەمانەی سەرەوە:

﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾[٢٠]

---

[٢٠] - سورة الرعد - ١٦

(ئەی محمد ﷺ به خوانەناسان) بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویه؟ (ئەگەر ئەوان بێ دەنگ بوون) تۆ بڵێ: الله پەروەردگاریانه، (چونکه ئەوانه کەڕ کوێرو لاڵن لەوانەیه دان بەو ڕاستیەدا نەنێن) پاشان پێیان بڵێ: ئایا ڕەوایه جگه لەو خوایه پشت به شتانی تر ببەستن و بیانکەنه پشتیوان و خۆشەویست، که ئەوانه تەنانەت بۆ خۆشییان قازانج و زەرەریان بەدەست نیه؟! هەروەها بڵێ: باشه ئاخر کوێر و چاوساغ وەك یەکن؟! تاریکی و ڕووناکی چوونیەکن؟! (دیاره خوانەناسی و بێ دینی کوێری و تاریکیه، ئیمان و باوەڕو خواناسیش چاو ساغی و ڕووناکیه)، بەڵکو چەند هاوبەشێکیان داناوه بۆ خوا، کەشتیان دروستکردووه وەك دروستکراوەکانی خواو جا دروستکراوەکەیان لێ شێواوه، پێیان بڵێ: الله بەدیهێنەرو دروستکاری هەموو شتێکه و ئەوزاته تاکوتەنهاو بەدەسەڵات و بەهێزو به توانایه.

﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[٢١]

واتە: ئایا نەتزانی خودا حوکمڕانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە، هەرکەسێک بیەوێت سزای دەدات و هەرکەسێک بیەوێت لێی خۆش دەبێت، خوداش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾[٢٢] واتە: بڵێ: کێ لە ئاسمان و زەویەوە ڕزقتان دەدات، کێ بیستن و بینینی هەیە، کێ زیندووەکان لە مردووەکان دەردەهێنێت، و مردووەکان لە زیندووەکان دەردەهێنێت و هەرکەسێک مەسەلەکە بەڕێوە بیات، دەڵێن (خوای گەورە)، بۆیە بڵێن: ئایا لە خودا ناترسی؟

---

[٢١] - سورة المائدة - ٤٠

[٢٢] -[سورة یونس - ٣١].

﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[٢٣] هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی خوا بەکاردەهێنن بۆ غەیری خوا)، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا.

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾[٢٤]واتە: هیچ شتێک وەک ئەو نییە و هەر ئەویش بیسەرو بینایە.

﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ * لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾[٢٥]واتە: بڵێ: بەڕاستی دوعا و قوربانی و گیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانە، ئەو هیچ شەریکێکی نییە، لەگەڵ ئەوەدا فەرمانم پێکراوە و من یەکەم کەسی موسڵمانانم.

---

[٢٣] - سورەی الأعراف،١٨٠

[٢٤] - سورة الشورى - ١١

[٢٥] - سورة الأنعام ١٦٢-١٦٣»

## ڕوکنی دووەم باوەڕبون بە ڕۆژی دوایی.

دەبێ باوەڕمان بە ڕۆژی دوای و کۆتایی هەبێت لەو ڕۆژەدا هەموو مەخلوقێک زیندوو دەکرێتەوەو لەمەیدانی مەحشەر ڕادەگیرێت بۆحیساب و کتاب وە پێش هاتنی قیامەت چەندان نیشانەی بچوک و گەورە دەر دەکەوێت.

*باوەڕمان بە تەرازوو هەیە دووتای هەیە بۆ کێشانو پێوانی کردەوەی بەندەکان.

* باوەڕمان بە دەفتەری کردەوەکان هەیە کە دەدرێتەوە بەندەکان ئەهلی بەهەشت بەدەستی ڕاست وەری دەگرن ئەهلی جەهەنەمیش بەدەستی چەپ.

*باوەڕمان بە حەوزی کەوسەری پێغەمبەری خوا هەیە کە ئەهلی ئیمان لێی دەخۆنەوە و بەس بۆ ئەهلی ئیمانە.

* باوەڕمان بە پردی سیرات هەیە کە بەسەر جەهەنەم دا دەڕوات بەندەکانی بەسەری دا دەپەڕنەوە ئەهلی بەهەشت نەجاتیان دەبێت لەسیرات ئەهلی جەهەنەمیش دەکەونە خوارەوە.

* باوەڕمان بە وەهەیە کە الله تعالی دەبینرێت لە قیامەت بەچاوی سەر .

* باوەڕمان بە بەهەشت و جەهەنەم هەیە دروستکراون و لەناو ناچن دەمێنەوە بۆ هەتایی.

* باوەڕمان بەشەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ هەیە شەفاعەت دەکات.

## ڕوکنی سێیەم  باوەڕ بوون بە پێغەمبەران علیە صلاة والسلام.

باوەڕمان بە هەموو نێردراوانی اللە تعالی هەیە بێ جیاوازی  بەڵام لە فەزڵ دا جیاوازیان هەیە.

هەندێک پێغەمبەر نبی  بوون کە نبیش شەریعەتی تازەی پێیە وە هەندێک رسول بوون رسول یش  لەسەر شەریعەتی پێش خۆی دەڕوات  هەموویان بۆ بانگەشەی خواپەرستی هاتون بەبێ شەریک و تاکو تەنها اللە بپەرستن، وە دوور کەونەوە لەو شەریک و هاوەڵانەو عەبدە لە سنوردەرچوە کان.

## چوارەم باوەڕ بوون بە کتێبە ئاسمانیە کان

وەکو: قورئان، تەورات، ئینجیل زەبور، صحوف، ئەمانە کتێبە ئاسمانیەکانن باوەڕ بوون پێیان واجبە.

دەبێ بزانین ئەو کتێبە ئاسمانیانە لەلایەن الله نێردراون کەلامی الله ن وە قورئان حوکمرانی هەموو کتێبەکانی پێش خۆی دەکات.

قورئانیش کەلامی الله یەو مەخلوق نیە قورئان وتەی خوایە دروست کراو نیە بۆیە نابێت بە سیفەتەکانی الله بڵێین دروست کراو قورئانیش وتەی اللەیەو وتەی اللەش سیفاتی الله یە.

باوەڕمان وایە ئەو کتێبانە لەلایەن الله دابەزێنراون و وتەی اللەن باوەڕمان بەهەموویان هەیە.

وەقورئانیش تاکە کتێبە کە حوکمی هەموو یان دەکات.

## پێنجەم باوەڕ بوون بە فریشتە کان.

باوەڕمان وایە فریشتە کان دروست کراو بەندەی اللەن لەگوێڕایەڵی و عیبادەتی الله دان وە لە پلەی ئیماندا جیاوازن ئیمانیان جیاوازە لە ئیمانی مرۆڤەکان لەڕووی زۆری ئیمان و کەمی ئیمان.

# شەشەم باوەڕ بوون بە قەزاو قەدر بەشەرو بە خێرەکەی

کە واجبە باوەڕمان بە قەزاو قەدەر هەبێت  قەدر علمی اللەیەو نابێ ڕەتی بکەینەوە  چونکە پێی کافر دەبیت قەدری ئێمە نوسراوە لە شەرو خێرو ڕزق و ئەجەل.

ئێمە ناچار کراو نین بە قەدر بەڵکو هەڵبژاردن لەدەست خۆماندایە.

الله تعالی علمی بەو هەڵبژاردنەو کارەی ئێمەیە کە لەداهاتوو ئەنجامی دەدەین نەک ناچار کراو بین بە قەدر.

ئیسلامان باس کرد، وە ئیمانیشمان باس کرد، دێینە سەر باس کردنی ئیحسان.

ئیحسان واتا چاکەکاری، مەرجی چاکە کردن ئەوەیە کە تۆ هەم وا چاکە بکەیت الله ئەبینی هەم الله تعالی تۆ دەبینێت.

هەرکارێکی چاکە کە دەی کەیت کە باس مان کردووە دەبێت لە سێ شت دا خۆی ببینێتەوە.

یەکەم: إخلاص واتا نیەتی پاک.

دووەم: تەنها بۆ الله تعالی بێت بێ هیچ شەریکو هاو بەشێک تەنهابۆ الله.

سێیەم: وابەستەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت واتا دور بێت لە هەموو داهێنراو خورافیاتێک دور لە ڕەئی و بۆچون تەنها بەبەڵگەی قورئان و سوننەت کاری پێ بکرێت.

چاکە کردن لەگەڵ موسڵمان دەبێتە مایەی ئەوەی کە ڕەزامەندی اللەی پێ بەدەست بێنیت خۆ پاراستن لە ئاگری جەهەنەم پەنا بە الله تعالی.

هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (إِتَّقُوا النَّارَ ولَوْ بِشِقِ تَمْرَةٍ)[٢٦]

واتە: خۆتان بپارێزن لەئاگری جەهەنەم بە لەتە خورمایەکیش بێت.

گرنگ چاکەیەک و بەخشینێک بێت تەنها بۆ ڕەزامەندی الله بێت گەورەی و بچوکی زۆر جار پێوەر نیە.

مرۆڤ دەبێت خۆی لە خەشم و قینی الله بپارێزێت نابێت سەرپێچی الله بکات بێ فەرمانی الله بکات لە هەر کاتێک و هەر جێگەیەک بێت هەر وەک الله لەباسی ئەو بەندە چاکە کارانەی کە لە پەنهانیدا گوناح ناکەن و پشت لە چاکە ناکەن الله پلەیەکی بەرزی پێ بەخشیون.

دەفەرمووێت: ﴿مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾ واتە: هەر کەس لەخوای میهرەبان بترسێت و لەپەنهاندا خۆی لەگوناه بپارێزێت و بەدڵێکی بەئاگا و تەوبەکارەوە بۆ بارەگای خوا بگەڕێتەوە...

---

[٢٦] - رواه البخاري ،١٤١٧ ،

(جا بەو بەختەوەرانە دەوترێت):

﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ﴾

بفەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ئاشتی و ئارامی وهێمنیدا، ئا ئەوەئیتر ڕۆژی نەمریی و نەبڕاوەیە.

﴿لَهُم مَّا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾[٢٧]

هەرچیش داوای دەکەن و حەزی لێ دەکەن بۆیان ئامادەیە تیایدا، زۆر لەوەش زیاترمان لایە)

مرۆڤ چاکە کار لە تەنهای و پەنهانی دا لە ناو خەڵکدا هەموو کاتێ سڵ دەکاتەوە لە خراپەو ئەهلی چاکەیە هەست بە چاودێری الله تعالی دەکات.

[٢٧] - سورەتی ق

دەبێت سەبر بگریت لەسەر ئەم دینە هەر وەکو سەبر گرتن سێ جۆرە.

یەکەم: سەبر لەسەر چاکەکردن و ڕێگری لە خراپە.

دووەم: سەبر گرتن لە سەر نەکردنی گوناح و تاوان خۆت بگریتەوە لە حەزو ئارەزووەکانت سەبر بگریت.

سێیەم: سەبر گرتن لەسەر تاقیکردنەوە کانی الله کە لە دونیا تاقی دەکرێیە وە بە لەدەست دانی خۆشەویستانت یان بەڵاو موسیبەتێک دەبێ سەبر بگریت نەک لەناچاری دەبێ لەیە قینەوەو لە ئیمانەوە بێت ئەو سەبر گرتنە.

بۆی ڕەزامەندی و خۆشەویستی و بەهەشتی الله تعالی پێ بەدەست بێنیت.

## پیناسەی شیرک و جورەکانی.

شیرک: واتای چیە ؟

شیرک: واتە هاوبەش و هاوەڵ بریاردان.

واتە: هاوبەش و هاوەل بریاردانی بۆ الله تعالی وە الله تعالی بەریە لە هەموو شیرک و کوفرێک، وە الله تعالی پاک و بیگەردە لەو شیرک و کوفرەی مروڤ ئەنجامی دەدات بەرامبەر بە خوای گەورە

ئەنجامدەری شیرک کێیە؟

ئەنجامدەری شیرک هەندێک لەمەخلوقی اللەن کە بەرامبەر بە الله تعالی ئەنجامی دەدەن بەوەی کە عەبدەکان بریار دەدەن لەسەر هاوبەش و هاوەل بۆ الله تعالی.

حوکمی شیرک چیه جۆرەکانی چین و  له چیدا ئەنجام دەدرێ؟

هەرکەسیک هاوەل و هاوبەش بۆ الله تعالی بریار بدات  و  بیکاتە هاوبەش بۆ الله تعالی  پەنا بە الله تعالی پێی لە دین دەچێتەدەر  ئەو کەسە پێی دەچێتە جەهەنەم بەلگەش بۆ ئەمە:

﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ﴾[٢٨]

بۆ نموونە کەسیک هاوار دەکاتە غەیری الله تعالی بۆ نموونە شیخ فلان قەبری پیاو چاکان و  هاواری لی بکات و داوای یارمەتی لی بکات، لەو کاتەدا پێی لە دین دەچێتە دەر و  چونکە شیرکی بۆ الله تعالی بریار داوە حوکمی ئەو کەسە ئەوەیە کافر دەبێت و پێی لە دین دەچێتەدەر  لیَ خۆش

---

٢٨ - سورە المائدە ٧٢

بوونی بۆ نیە گەر بێت و ئەو شیرکەی کە ئەنجامی داوە شیرکی گەورە بێت پێی لە دین دەچێتە دەر  وە الله تعالی لێی خۆش نابێت،

بەڵگەش بۆ ئەمە، الله تعالی دەفەرموویت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا﴾[٢٩]

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە.

---

[٢٩] - سورە النساء ٤٨.

پیغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: (من لقی الله لا یشرک به شیئا دخل الجنة ومن لقیه یشرک به دخل النار)[٣٠] هەرکەس بگەڕێتەوە لای خوا و هیچ شتێکی نەکردبێتە هاوبەشی دەچێتە بەهەشتەوە وە هەرکەسیش بگەڕێتەوە لای الله تعالی و شتێکی کردبێتە هاوبەشی دەچێتە ئاگرەوە. پەنا بە الله تعالی

زانیمان شیرک واتە هاوەل بریاردان وە حوکمەکەشی ئەوەیە ئەنجام دەرەکەی بە هەتا هەتای لە جەهەنەم دەمێنێتەوە وە ئەگەر تەوبە بکات الله تعالی لێی خۆش دەبێت.

[٣٠] - . رواه البخاری ومسلم

## شیرک لە چی دا ئەنجام دەدریت؟

شیرک لە عیبادەتدا لە توحید الربوبیة، لە توحیدی الالوهیة بۆ نموونە.

لە تەوحیدی الربوبیة، بڕوای وایە جگە لە الله زیانی پێ دەگەیەنێت، بڕوای وایە کەسێک هەیە جگە لە الله تعالی شیفای دەدات، وەکو قەبریک یاخود شێخێک یاخود ئەولیاو پیاو چاکێک هەر شتیکی تر لە غیری الله تعالی یان چاوەزارێک اعتیقادی تەواوی خستۆتە سەر، بڕوای وایە کە ئەو قەبرە زیانی پێ دەگەیەنێت، بەلاو موسیبەتی لەسەر لادەبات ئەوا شیرکە لە توحیدی ربوبیة شیرکێکی گەورەیە.

یان لە تەوحیدی الالوهیة هەڵدەستێ سەمع و ریا کە عیبادەتی غەیری الله دەکات، بۆ نمووتە: کەسێک هەڵدەستیت نویژی فەرز دەکات لە پێش چاوی خەڵکی لە سەرەتاوە نیەتی خەڵکەو بۆ ڕەزامەندی خەڵک دەی کات لەوکاتەی کە دەیبینن پێی لە دین دەچیتە دەر لە ئیسلامدا و پێی دەبێتە کەسێکی موشریک نوێژی بۆ غەیری الله تعالی کردوە.

وه الله تعالى دەفەرموويت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[٣١] ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و (سەرجەم چاکە و بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە.

بەلام ئەو لێرەدا وا نالێ دەلێت بەشی عەبدیشی تێدایە الله تعالى بەشی عبدی ناوێت بەڵکو دەیداتەوە بە چاویدا وە پێویستە موسڵمان اخلاصی هەبێت لە عیبادەتەکانیدا، الله تعالى دەفەرموويت: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾[٣٢] واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەڕێك و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی خوا.

---

[٣١] ـ الانعام ١٦٢
[٣٢] ـ البينه ٥

بۆیه زانیمان حوکمی شیرک ئەوەیە کەسەکە دەچێتە ئاگری جەهەنەمەوەو. بۆ هەمیشە لە ئاگردا دەمێنێتەوە گەر بێت و تەوبە نەکات بەو شیرکانەوە گەڕابێتەوە بۆ لای الله تعالی کافرو موشریکە بۆ هەتای لەجەهەنەمە.

شیرک دەبیتە دوو جۆر.

١-شیرکی گەورە

٢- شیرکی بچوک.

شیرکی گەورە وەکو قوربانی کردن بۆ غەیری الله تعالی، جا حەجمی قوربانیەکە هەرچەند بێت مێشێک بێت، یان حوشترێک بێت، یان بەرانێک بێ جیاوازی نیە چونکە بۆ غەیری الله تعالی ئەنجامی داوە پەنا بە الله تعالی ئەوە شیرکێکی گەورەیەو پێی لە دین دەچێتە دەرەوە پەنا بە الله تعالی پێی کافر دەبێ و پێی دەخرێتە جەهەنەم بۆ هەتاهەتایە.

زانیمان حوکمەکەی گەر کەسێک ئەو کارە بکا ئێمە چاوپۆشی لێ دەکەین نەخێر ئێمە خۆمانی لێ بێ بەری دەکەین، الله تعالی دەفەرموویت:
﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ

مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾[٣٣] واته ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن، جگە لەو بەڵێنەی ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، دەسەڵاتی خوایشم نیە ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بهێنێت، ئینجا وتی: پەروەردگارا، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

بۆیە کەسێک کوفر و شرکی گەورە ئەنجام بدات بێشک لەدین دەر دەچێت.

[٣٣] - المتحنه ٤

شيركی بچوک: وەكو هەلواسينی چاوەزار، پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموويت: (من تعلق تميمة فقد اشرك)[٣٤] هەركەسێک چاوەزار هەڵ بواسێت لە ماڵەكەيدا شيركە.

تميمة واتە هەموو ئەو شتانەی وەكو چاوەزار بەكار دەهێنرێن ئەمانە شيركی بچوكن لەئەسڵدا، ئەگەر بێت و هەلی بواسێت و بڵێت وەكو سەبەبێک باوەڕی تەواوەتی پێ نەبێت هەموو تەمەنايەكی نەخاتە سەر ئەوە شركی بچوكە بەڵام ئەو شركەش الله تعالی لێی خۆش نابێ لە شيركی بچوک دەيخاتە جەهەنەمەوە بەپێی قياسی شيركەكەی دەيسوتێنێت، پاشان الله تعالی دەيهێنێتە دەرەوە لە ئاگری جەهەنەم الله تعالی بە هەتا هەتای لە جەهەنەمدا نايهێڵێت بۆ نموونە شيركی بچوک وەكو رياء كابرا نوێژی سوننەت دەكات نيەتی خەڵک بێت. يانی ئەمە شيركی گەورە نيە وە شيركی بچوكە وە گەر بێت و تەوبەی لەسر نەكات الله تعالی دەيخاتە جەهەنەمەوە بەپێی قياسی تاوانەكەی وە گەر تەوبەی كرد الله تعالی لێی خۆش دەبێ.

---

[٣٤] - متفق عليه

## ئایه شیرکی بچوک دەبێتە شیرکی گەورە ؟

بەڵێ وەکو وتمان نموونەی چاوەزارەکە.

ئەگەر چاوەزارەکە لە ماڵێکدا هەڵبواسی تەنها بڵێت وەکو سەبەبیک بڵێت و باوەڕم پێی نیە تەنها وەکو ئەوە هەلی دەواسم، ئەوە شیرکی بچوکە. بەڵام ئەگەر بێت و بڵێ ئەوە دەیگێرێتەوەو ئەوە چاوەزارە چاو دەگەڕێنێتەوە، یەقینی پێی هەبێت و ئیعتیقادی بخەیتە سەر پە نا بە الله تعالی پیێ دەچێتە دەر لەدین دەبێتە شیرکی گەورە.

یاخود ریاء لە نوێژێکدا یانی لە نوێژێکی فەرزدا بۆ نموونە نوێژی سوننەت فەرقی هەیە لە نوێژی فەرزدا، سەردەکێشی بۆ شیرکی گەورە دەبێتە شیرکی گەورە پەنا بە الله هەرشتێک شیرکی بچوک بێت بەتەواوی اعتیقادی بخەیتە سەر سەردەکیشێ بۆ شیرکی گەورە و ئەنجامدەرەکەی پێی لە ئیسلام دەچیتە دەر، شیرکی بچوک پێی ناچێتە دەرەوەی ئیسلام، شیرکی گەورە ئەوەیە خاوەنەکەی بە هەتاهەتای لە جەهەنەم دەمێنێتەوە. پەنا بە الله تعالی

وە شیرکی بچوک بە هەتا هەتای نامێنێتەوە.

مەوقیفمان چۆنە بەرامبەر کەسێک کە شیرک دەکات و پێی دەڵێن کافرو موشریک بەڵام لە حوکمدا لە جۆری کەسەکاندا جیاوازە هەندێ کەس حوکمەکەی لەدوای ئیقامە حوجە دەدرێت. وەک وتمان: هەموو کەسێک کە شیرک و کفری هەبێت پێی دەڵێن: کافرو موشریک مەرج نیە حوکم و حەدی کافرو موشریکی بەسەردا بسەپێنرێ ئەنجامدەری شیرکی گەورە خوێن و ماڵی حەلالە ئەنجامدەری شیرکی بچوکە خوێن و ماڵی حەلال نیە وە پێویستە هەموومان ئەوە بزانین کە الله زۆر لێ خۆش بوو میهرەبانە بەرامبەر مروڤەکان. وەکو دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[٣٥]. ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوا لەهەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیە و زۆر بە سۆزو میهرەبان نیشە.

---

[٣٥]- الزمر ٥٣

## ڕوونکردنەوەیەک لەسەر کوفر.

کوفر لە زمانەوانیدا بەمانای شتێکی شاراوە دێت.

کێ کوفر دەکات و حوکمی چیە؟

کەسێک کوفر دەکات بەرامبەر بە الله تعالی بەرامبەر بە کەلامی الله تعالی بەرامبەر بە نێردراوی الله تعالی کە پێغەمبەرە ﷺ

کوفر چەند بەشە؟

کوفر سێ بەشمان هەیە کوفرمان هەیە لە دڵدایە کوفری اعتیقادی کوفری بیرو باوەر.

کوفری لفظی کوفری وتەیە .

کوفر مان هەیە عملی واتە: کوفری کرداری.

بۆ نموونە نیفاق و دووڕووی لە دڵدایە کوفرە و لە ناو دڵدایە، کوفری زمان وەکو جنێودان بە اللە تعالی بە پیغەمبەر ﷺ پەنا بە اللە تعالی کوفر بە قورئان گاڵتە کردن بە پێغەمبەر ﷺ قسە وتن بە اللە رسول اللە ﷺ قورئان ئەوان هەمووی کوفرن.

کوفری لفظین وەکو فەرمان هەیە عەمەلیە بۆ نموونە سەر برین بۆ غەیری اللە تعالی هەم شیرکە هەم کوفرە بە جەستە دەکرێت، واتە کوفری عەمەلە وەکو نوێژ کردن بو غەیری اللە تعالی دەبێ بزانین هەموو کوفرێک شیرک نیە بەڵام هەموو شیرکێک کوفرە بەلام جاری وایە کوفر نابێتە شیرک بریاردان بۆ اللە تعالی جاری وایە هەموو کوفرێک نابێتە شیرک بەڵام هەموو شیرکێک دەبێتە کوفر بۆ نموونە نوێژ کردن بۆ غەیری اللە تعالی شیرکە و کوفریشە وە نموونەی تر وەکو جنێو دان بە اللە تعالی کە ئەم کوفرە بەڵام شیرک نیە دڕاندنی قورئان شیرک نیە بەڵام کوفرە لێرەدا تیێدەگەین کە هەموو شیرکێک کوفرە بەڵام هەموو کوفرێک شیرک نیە وە ئەمە قەولی امام شافعیە (رحمە اللە) جا بۆیە زانیهان کوفری عەملی کوفری اعتیقادی و کوفری لفظی مان هەیە.

بزانین کوفر چەند جۆرە.

دوو جورە، کوفری گەورەمان هەیە. کوفری بچوکیشمان هەیە.

وەکو وتمان کەسەکان کوفر دەکەن بەرامبەر الله تعالی وە حوکمەکەی ئەوەیە پێی لە دین دەچێتە دەر ئەو ئینسانەی کوفری گەورە ئەنجام دەدات پێی لە دین دەچێتەدەر، وە حوکمەکەی لا الله تعالی ئەوەیە لێی خۆش نابێ و دەیخاتە جەهەنەمەوە لێرەدا کەسەکان ئەنجامی دەدەن بەرامبەر بە الله تعالی وە سزاکەشی ئاگری جەهەنەمە بۆ هەتا هەتای وە ئەگەر تەوبەی لێ بکات الله تعالی لێی خۆش دەبێت.

جیاوازی کوفری گەورە و کوفری بچوک:

کوفری گەورە ئەنجامدەرەکەی بۆ هەمیشە لە ئاگردا دەمێنێتەوە بەڵام کوفری بچوک ئەنجامدەرەکەی دوای وەرگرتنی سزاکەی لە جەهەنەم دێتە دەرەوە بەویستی الله تعالی کوفری گەورە خوێن وماڵی حەلال دەکات، وە کوفری بچوک خوێن و مالی حەلال ناکات وە مروڤ هەیە بە قەولێک وتەیەک کافر دەبێت و هەیە بە عەمەل و کردار هەیە بە اعتیقاد بیروباوەڕ کافر

دەبێت  الله تعالی لە قورئاندا باسی ئە کومەلە دەکات کە  گاڵتەیان بە الله و رسولەکەی کرد اللەش پێی فەرموون:

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ﴾[٣٦] (کاتێک تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەگوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت) و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمەو گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟!

﴿لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾[٣٧]. (ئیتر بێ سوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین (بەهۆی کاری نابەجێیەوە) چونکە بەڕاستی ئەوان تاوانبارو تاوانکار بوون.

---

[٣٦] ـ التوبة ٦٥

[٣٧] ـ التوبة ٦٦

وە هەر کەسێک بلێت من نالێم کەس کافر ناکەم ئەگەر کوفری لێ ببینێت بلێت ئەوە ئیشی من نیە ئەوە ئیمانی خۆی هەڵدەوەشێتەوە ئەو کەسەی الله تعالی و پێغەمبەر ﷺ بەکافریان زانی بێت ئەوە لای ئێمەش کافرە. چونکە الله تعالی دەفەرمووێت عوزرتان بۆ نیە دواى ئەوەی باوەڕتان هێنابوو چونکە الله تعالی دەفەرموویت: ﴿لا تعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم﴾ یانی بەلێ کەس هەیە لەدوای ئیمان هێنان کافر بیت وە کافر دەبێتەوە دەبێتە کەسیکی کافر.

ئەوە قسەیەکی باطلە بلێت من بەکەس نالێم کافر یان کەس کافر ناکەم یانی بلێ کەس نازانی نەخێر الله تعالی لە قورئاندا باسی کردوە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بە کەسێک کردوە کە کافرە ئێمەش هەمان شت هەمان مثل ئەو ببینینەوە پێی دەڵێن کافر پێی دەڵێی لە دین چوتە دەر و هیچ عوزرێکی نیە وەکو کەسێک گاڵتە بە دینی الله تعالی بکات.

یان بە رسول اللە ﷺ بکات هیچ عوزرێکی نیە لێرەدا پێی دەڵێین کافر ﴿قدر کفرتم بعد إيمانكم﴾ بەلێ کافر بوی دوای ئەوەی ئیمانت هێناوە.

کوفرت هەبووە لەبەر ئەوە ئەوە اعتیقاد و بیروباوەری ئێمەیە الله تعالی دەفەرموویت: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّي قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا﴾[٣٨] واتە: بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا، بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتوە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە.

---

[٣٨] ـ البقرة ٢٥٦

چونکه تەکفیر پێش ئیمان هینان بە الله تعالی یە بۆیە بە کەسێک دەڵێین کافر کە کوفر دەکات بە کەسێک دەڵێن موشریک کە شیرک ئەنجام دەدات بە کەسێک دەڵێن کافر و عوزرت نیە کە گاڵتە بە الله و بە رسول الله ﷺ دەکات یان بە شیعاریکی دین چی نیقاب یان ریش یان شیواک یان هەر سوننەتێکی تری رسول الله ﷺ پێی دەڵێین کافروعوزری بۆ نیە.

## الولاء، البراء.

پێویستە بزانین ولاء واتای چی واتا خۆش ویستن  پشگیری و پشتیوانی.

بۆیە واجبە بزانین ئەو خۆش ویستنە مان بۆ کێیە و لە بەر کێیە.

خۆشویستنما تەنها لەبەر الله تعالی و شوێن کەوتوانی دینی الله بێت ئەهلی تەقواو ئیمان بێت  کەوانەبێت خەسارەت مەند دەبین لە قیامەت  ئەگەر بێت و ئەهلی شرکو کوفرمان خۆش بوێت  ئەهلی ئیمان نابین پێی.

البراء: واتا ڕق لێ بوونەوە. ڕق لێ بوونەوەشمان تەنها لەبەر الله و بۆ دوژمنانی اللەو پشت هەڵکردوانی دینی الله بێت.

هەموو خۆشویستنێک و ڕق لێ بوونەوەیەک لەسەر ئەساسی ڕەزامەندی الله تعالی دادەمەزرێت بۆکەسی ئیماندار.

مرۆڤ دەبێت وریای قیامەتی خۆی بێت چونکە کێت خۆش بوێت لەقیامەت لە گەڵ ئەو حەشر دەکرێیت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (المرء مع من أحب )[٣٩]

کێت خۆش بوێت لە قیامەت لەگەڵ ئەویت.

مرۆڤ پێویستە شوێن اللەو پێغەمبەر و ﷺ شەریعەتی الله بکەوێت وە خۆش ویستنیشی تەنها بۆ ئەوان بێت.

پێویستمان بە بەڕا ئەتێکی وەک پێغەمبەر إبراهیمە علیه السلام

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾[٤٠]

ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان

---

[٣٩] - متفق علیه.

[٤٠] - الممتحنة( ٤ )

وت: دوایساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن، جگە لەو بەڵێنەی ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، دەسەڵاتی خوایشم نیە ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بهێنێت، ئینجا وتی: پەروەردگارا، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

ئەهلی ئیمان نابین کافرو موشریک و ئەهلی گومڕاییمان خۆش بوێت ئەوانەی پشت هەڵکردون لەدینی الله تعالی.

## طاغوت واتا له سنور دەر چوو.

بۆ نموونە کەسێک لەسنوری عەبدایەتی دەرچوە و دەپەرسترێت و ئەویش ڕازییە بەو پەرستنە.

واتا بە کەسێک دەگوترێ طاغوت کە عیبادەتی بۆ بکرێت و ئەویش ڕازی ییەبەو عیبادەتەو ڕێگر نیە لێی کە عیبادەتی بۆ نەکرێ.

واجبە ئێمە کافر بین بە طاغوت ، طاغوت بە کافر بزانین وە شوێن کەوتوانی و ئەوانەی گوێڕایەڵو پشتیوانی طاغوتن.

پێش ئیمان هێنان کوفر بە طاغوتە واتا پێش ئەوەی ئیمان بێنین دەبێت ئێمە کوفر بە طاغوت بکەین وەک الله تعالى دەفەرموێت.

﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[٤١]

بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا)، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە)

---

[٤١] - البقرة ( ٢٥٦ )

وەک کەسانێک دەڵێن ئێمە بەکەس ناڵێین کافر ئەوەتا الله دەفەرمووێت کوفر بە طاغوتبکە ئەوجا ئیمان بێنە بەکافر بزانە ئەوجا ئیمان بێنە.

یان شوبهەیەک لەلایەن هەنێک کەس کە گوایە پێغەمبەر عیسا علیه السلام کە پەستراوە بۆطاغوت نیە دەڵێین ئەوە قسەیەکی بەتاڵە چونکە پێغەمبەر عیسا علیه سلام ڕازی نەبووە بەو پەرستنە وە دەشڵێین دەبێت ئەو کەسە ڕازی بێت بەو پەرستنە کە بۆی ئەنجام دەدرێت ئەوکات طاغوتە.

وصلى الله وسلم و بارک على سيدنا محمد وعلى آله و صحبه و من تبع نهجهم الى يوم الدين.